# تەفسیری
# ئایەتی کورسی
# لەگەڵ (٤٠) سوودیدا



نووسینی
محمد بن صالح العثيمين

وەرگێڕانی
إلياس محمد الكردي

# تەفسیری
# ئایەتی کورسی
## لەگەڵ (٤٠) سوودیدا


نووسینی:

محمد بن صالح العثیمین

وەرگێرانی:

إلیاس محمد الکردی



چاپی یەکەم

١٤١٩ کۆچی　　　　١٩٩٩ زایینی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ
وَلَا نَوْمٌ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ مَن ذَا
ٱلَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا
خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ
وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ
حِفْظُهُمَا وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ ياأيها الذين امنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون ﴾ (ال عمران: ١٠٢)

﴿ ياايها ايها الناس اتقوا ربكم الذى خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذى تساءلون به والارحام ان الله كان عليكم رقيبا ﴾ (النساء: ١)

﴿ ياايها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفرلكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ (الاحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد فأن أصدق الحديث كتاب الله ، وخير الهدى هدى محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة فى النار.

ئـەم نامیلکەیـە تەفسـیری ئایـەتی کورسـی دەکـات بەشێوەیەکی جوان و وردەکاری ولەڕووی ناوسیفەتەکانی خوای پـەروەردگار. زۆر بـەرێك و پێکـی لێی ئـەدوێت. (الاسماء والصفات) کەشایستەی ئەوەن موسڵمان دەربارەی ناوە جوانەکانی خواو سیفەتە بەرزەکانی بیزانێت بەتایبەتی کەنووسـەرەکەی شـێخ (محمـد صـالح العثیمین ) ە. کـە بەڕاستی زۆر لێهاتووە. لەو بـوارەوە بۆیەبەچاکم زانـی ئـەم نامیلکەیە بکەم بەکوردی بۆئـەوەی موسـڵمانان لـێرە. سـود وەرگرن لەوزانستە کەدەربارەی ناوەکانی خواو دەربارەی سیفەتەکانی دەربارەی ئـەم ئایەتەیـە کـە لەوانـە یـە هـەموورۆژێك دووبارەبکرێتـەوە بۆ ئەوەی کـاتێك دەیخوێنیتەوە بەتێگەیشتنەوە بیخوێنێتەوە.

خوای پەروەردگار ئـەم نامیلکەیـە بکە بە تێشوو یەك بۆم لەرۆژی دوای.

إلیاس الکردی

١٤١٩ هـ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين، واصلي واسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين...امابعد..

ئەمە تەفسیری ئایەتی کورسیە (اية الكرسي)، کە لەجزئی دووەمی قورئان لە سورەتی (البقرة) لەئایەتی (٢٥٥) دایە لەگەڵ ئەوسوودو زانیاریانەی کەلێوەرئەگیرێت ولێ دەردەهێنرێت. داواکارین لەخوای تعالى. کەسودمان پێبگەیەنێت بەوەی فێری کردووین لەزانست وزانیاری چونکە هەرخۆی بەخشندەو بەزەییە

محمد بن صالح العثيمين

بسم الله الرحمن الرحيم

خوای گەورە کاتێك دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ ئەم ئایەتە گەورەترین وگرنگ ترین.ئایەتی قورئانی پیرۆزە. پێغەمبەر(ﷺ)پرسیاری کرد لە (ابی کوری کعب) (ﷺ) پێی فەرمووی: کام ئایەت گەورەترین و بەرێزترین ئایەتە وتی ئایەتی کورسی.

پێغەمبەر (ﷺ) دەستێکی لە سنگی‌دا وفەرمووی: «هەڵتهێنانەی (ابامنذر)»، (متفق علیه).

بۆیەهەرکەسێك لەشەودابیخوێنێت. تابەیانی خوای گەورەپارێزگاری دەکات و شەیتان لێ نزیك ناکەوێتەوە ئەم ئایەتە بریتی‌یە لەدەرستە. هەر رستەیەك ومانایەکی بەرزوگرینگی تایبەتی خۆی هەیە:بە تایبەتی‌خوای گەورە دەفەرموێت (الله) ئەم ناوەتایبەتە بەزاتی‌بەرزی‌خوای گەورە. وەبۆهیچ کەس بەکار نەهێنراوە . نەلەسەردەمی جاهیلیەت (الجاهلیة) ونەلەسەردەمی ئیسلامدا ،چونکە الله خوای هەموو جیهانە. (الله) لێرەدا(مبتدا)ە وەئەوەی لەدوای ئەودەیت. (خبر)ە وەکاتێك دەفەرمووێ: ﴿الله لا الە الا هو﴾ ئەمەحوکمی یەکەمە ﴿لا الە الا هو﴾ واتە: (الە) بەمانایی (المالوە) دێت (المالوە)یش واتە ئەوکەسەی دەپەرسترێت بەخۆشەویست زانین وبەگەورزانین جاهیچ

کەسێك حەقی ئەم وەسف کردنەی نیە تەنها خوای پەروەردگار نەبێت وە ئەو (إلە)نەی کەلەسەر زەوی ئەپەرسترێن وە لەئاسمان ئەپەرسترێت لە مەلائیکەتەکان هیچ کامیان حەقی ئەوەی نیـیە بپەرسترێت.

هەرچەندە بەخوا (إله) ناوئەبرێت بەلاٚم حەقنیە. بەلٚکو تەنها خوای پەروەردگاری جیهان ئەم مافەی هەیە وەك خوای گەورەدەفەرمووێت: ﴿ياأيُّها الناس اعبدوا ربكم الذى خلقكم﴾..واتە: ئەی خەلٚکینە ئەو خوایە بپەرستن کە ئێوەی دروست کردووە هەروەها (الە) ئێرە(اسم)ە بۆ(لا) (لەرووی شیکردنەوەی ڕیزمانەوانی). وە ئەم(لا)یە واتە نیە. نەفی جنس دەکات وەلەزمانی عەرەبی(لا) یەك نەفی جنس بکات بەمانەی نەفی کردنێکی ڕەهادێت. واتە نەفی یەکی گشتی هەموو خوایەکانی تردەکات بەبێ(استثناء) جگە لەخوای گەورەنەبێت. کاتێك دەفەرموێت: ﴿لاالە﴾ نەفی گشتی هەموان دەکات لەخوا ناحەقەکان. وەکاتێکیش دەفەرمووێ: ﴿الاهو﴾ واتە: تەنها ئەو نەبێت لە جیاتی(خبر)ە بۆ(لا) چونکە خۆی لەئەصلا ناوادێت ماناکەی ﴿لااله حق الاهو﴾ ئەم ڕستەیە ئەوە دەسەلمێنێت. کەخوایەتی حەق نەفی دەکات بۆ هەموو خواناحەقەکان جگەلە خوای پەروەردگار نەبێت.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿الحي القيـــوم﴾ ئەم دووناوە. لـــەناوە جوانـــەكانی خـــوای گەورەیـــە. وەهـــەردووكیان كۆكەرەوەی هەموو تەواوی وجوانی سیفەتو كردەوەكانی خوای گەورەن. ئەو پەڕی تەواویو جوانی لە ﴿الحـــي﴾. بۆسیفەتەكانیەتی وە﴿القیوم﴾ ئەوپەڕی تەواوی وجوانی بۆ كردەوە كانیەتیچونكە مانایی الحی.واتە ژیانێكی تەواوی هەیە چونكە (ال) كەبە(حی) نووسارە بەڵگەی زۆر تـەواوی لـەژیاندا لـەرووی بـوونو نەبونـەوە وەلـەرووی تـەواوی وكەمیدا چونكە ئەگەر سـەیری مرۆڤ بكـەین. ژیـانی لـە نەبوونـەوە هـاتووە وەبـەرەو نـەبوون دەچێـت (مـن عـدم الی عـدم)[1] هـەروەها لـەرووی سـیفەتو كردەوەشـدا ناتـەواوە. چاوی ناتەواوە، گوێی ناتەواوە. وەقسەو كارو كردەوەكانی ناتەواون(ناقص). جا ئەم دونیا هەر بریتییە لە ناتەواوی لە هەموو ڕووێكەوە. لەڕووی بوونیو نەبوونی. وە پـەیدابووە بـ م لـەناو دەچێت. كەواتـە سـیفەتی ژیـانی تـەواو نیـە. هەروەها ناتەواوە لەڕووی پێداویستیەكانی ژیانەوە. كەچی خـوای پـەروەردگار. ژیانەكـەی (الحیـاة) تـەواوە لەهـەموو

---

(١) مەبەست لەنەبو نێك بۆ نەبونێك ئەوەیە كە دەمرێت پاش لەدایك بوونی بەڵام دوای خوای پەروەردگاری زیندووی ئەكاتە ئەوە مەتا مەتای.

ڕوویەکەوە. چونکە پێشتر لە نەبوون نەبووە. بەڵکو هەرهەبووە. وە کۆتایی هاتن و لەناو چوونی نیە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وتوكل على الحي الذي لايموت﴾ واتە: پشت ببستە بەو زیندوەی کە نامرێت. هەروەها دەفەرموێت: ﴿كل من عليها فان ويبقى وجه ربك﴾ واتە: هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین لەناو دەچن. تەنها وەجهی خوای گەورە دەمێنێت مرۆڤ جا بۆیە هەندێك لەسەلەفی سالح. دەفەرموون: واچاکە مرۆڤ، سوپاسی خوا بکات چونکە ئەمەیە شێوەی تەواوەتی لە ژییاندا بۆ خوای گەورە نەك هەر بەلەناو چوونی هەموو ئەوەی لەسەر زەوین. بەڵکو بە مانەوەی خۆشی ئینجا کەماڵی ئەم سیفەتەی تەواو دەبێت.

جا ئەم سیفەتە کە ئەوپەڕی تەواوەتیە لە سیفەتەکانی چاوو بیستن و زانینن و توانا و عیزەتدا وەلە هەموو تەواویەکان ئۆ بۆیە(حي). (ال) پێوەیە(الحي) چونکە بۆ هەموو سیفەتە کانێتی کە مانایی ژیان بەگشتی و لە هەموو ڕووەکانیەوە (القيوم) ئەصڵەکەی(قيام)ە. واتە: زۆر(قيام)ی هەیە(قيام) یش واتە نەفسی خۆی ڕاگیر کردووە. پێویستی بەکەس نیە یارمەتی بدات. وە هەروەها خۆی شتەکان هەڵدەسوڕێنێت و ڕاگیریان دەکات. وە ئەگەر ووتیان خوای

گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ﴾ وە ﴿ولينصرن الله من ينصره﴾ لەم ئایاتە خوای گەورە ئەوەی سەلماند. کەهەر کەسێ سەری بخات سەری دەخات. لێرەدا. ووتی: خوا سەربخات چۆن خوای گەورە ئەفسی خۆی ڕاگیر کردووەو پێویستی بەکەس نی یە.ئاواش دەفەرمویٚ؟ئێمەش دەڵێن: ئەم سەر خستنەی خوا. سەرخستنی دینەکەیەتی. ئەوەك زاتی پیرۆزی. چونکە هەر خۆی خەڵکی پێویستیان بەئەوەیە ئەویش پێوستی بە خەڵك نی یە خەڵکی پێویستیان پی ی هەیە لەدۆزینەوەو ئامادەکردن و یارمەتی داندان لە هەموو کارێك.

هەروەها کە دەفەرمووێ: ﴿لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾

واتە: وەنەوس و خەوتن نایەت بەسەریدا.نالێت ناخەوێ! بۆ ئەوەی بزانین کە خوای گەورە نە بەخۆی دەخەوێ نە خەودێت بەسەریدا. چونکە ئەگەر بیفەرموایە نا خەوێت ئەوا. بۆی هەبوو کە بەزیستی خۆی نەدەخەوت. بەڵام خوتن ئەهات بەسەریدا. وە خوای گەورە ناخەوێ چونکە خەوتن. ناتەواوییە کەلە ناتەواوی زاتی خۆی وە ناتەواوییە بە بەرامبەرە دروست کراوەکانی بۆ نموونە پیاوێك زۆر خەواڵووبێت. کرنکارێکی زۆری هەبێت. بەڵام هیچ

سەرژمێریەك و حیساب و هەڵسوڕاندنی نەکرد لەبەر خەوە کەی. ئەوا تەفسیریەی ناتەواوییە بەرامبەر بە کرێکارەکان.

هەروەها ناتەواویە لەزاتی خۆی چونکە ئەگەر خەوت دیارە لەشی ماندوو بووە. پێویستی بەحەسانەوە هەیە بۆ ئەوەی توزێ گورج و گۆڵتربێت بۆ کارەکانی داهاتوو.هەربۆیە ئەهلی بەهەشت ناخەون چونکە لەشیان کامڵە ژیانیان و ژینیان تەواوەو کامڵە. هیچ نەخۆشیەك یان ماندووبوونێك تووشیان نایەت ئەگەر ووتت ئێمە دەبینین ئەوەی ناخەوێ. لەبەر هۆیەك کە نەخۆشە یان شتێك لەم بابەتە. تۆش دەڵێی. ئەوەی ناخەوێ لەش و ژیانی کامڵەو ناتەواو نیە. پێیان دەڵێن. ئەوکەسەی ناخەوێ لەبەندەکان بێگومان بەبێ هۆنیە. بۆیە ئەت ناحەسێتەوە هەر لەئێش و ئازاردایە. چونکە لەشی مرۆڤ خوای گەورە ئاوای دروست کردووە کە تووشی ماندوو بوون دێت. بۆیە زۆر پێویستی بە خەوتن هەیە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾ واتە: ئێمە خەوتنەکەی ئێوەمان کردووە بەمایەی حەسانەوەو دابڕان لە ماندوو بووندا. جا ئەگەر خوای گەورە بخەوتبا. (حاشاالله) بەواتای ئەوەدەهات کەخوای گەورە ماندوو بووەو پێویستی بە حەسانەوە هەیە.

جا لەکاتی نووستنەکە هەموو دروست کراوەکانی لەناو دەچوون. چونکە دروست کراوەکانی بەردەوام پێویستیان بە یارمەتی خوا بە ئاگاداری خوا لەسەریان هەیە. هەر چۆنێک بێت. خوای گەورە. بەهیچ شێوەیەك ناخەوێ پێغەمبەر(ﷺ). دەفەرمووێ: «إنّ اللهَ لاينام ولاينبغي له ان ينام» واتە: خوای گەورە ناخەوێت ووشەی (لاينبغي) لەقورئان و فەرموودە. بەمانایی ئەوەنایەت کەبۆی نی یە هەرچەندە رووکەشی ئاوادیارە بە لکو مانای ئەو پەری نەبوونی شتێك لێرەشدا. ئەوە دەگەیێنێ کە موستەحیلە خوای گەورە بخەوێت. وەك خوای گەورە لە قورئان دەفەرمووێت: ﴿وما ينبغي للرحمن ان يتخذ ولدا﴾.

هەروەها ئەم سیفەتە ﴿لاتأخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ﴾ سیفەتی خراپە(سلبيي). جا بنچینەی ناو سیفەتەکانی خوای گەورە. ئەوەیە کە لەناو سیفەتەکانی خوای گەورەهیچ ناوێکی خراپ یان سیفەتێکی خراپ تیانی یە بەلکو خوای گەورە کاتێك باسی ئەم سیفەتە خراپانە دەکات بەمانای ئەوە کەئەم سیفەتە خراپانە لەودانیەو لەو ناوەشێت. کەواتە خوای گەورە لە هەموو رووێکەوە تەواوەو کامڵەو هیچ کەم کوڕیەك و خراپەیەکی تیانیە. کاتێك ناخەوێ لەبەر

ئەوەی چونكە هیچ كەم كوڕی لەلاشەی دانیە تاوەكو ماندووبێت و پێویستی بەنووستن هەبێت.

وە دەفەرمووێ: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾

واتە: ئەوەی لەئاسمانەكان دایە وە لەزەویدایە هەمووی هی ئەوەرستەی سێیەم دەفەرموێ: ﴿لــه مــا في السموات وما في الأرض﴾ ئەم ڕستەیە ڕستەیەكی(خبرية) واتە: هەوالدەرە. لێرە خەبەرەكەی پێش(مبتدا) كەوتووە. چونكە(له) خەبەرە وە(ما) (اسم موصول)ە (مبتدا)یە. ئەم(ما) یە بۆگشتی بە كاردێت. بۆیە(ما) بەكار هاتووە لێرە بۆ ئەوەی بەندەكان بگرێتەوە لەگەڵ حاڵەتەكان. ئەوەك لەبەر ئەوەی شتە بێ ئەقڵەكان زۆرترن لە ئەقڵدارەكان[٢]

چونكە كەس ناتوانێ بڵێت بێ ئەقڵەكان زۆرترن یان ئەقڵدارەكان. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: «مامن اربع موضع لبعة اصابع من السماء الا وفيها ملك قائم لله او راكع او ساجد».واتە: لە ئاسمانەكان هەموو جێگای چوار پەنجەیەك و ملائیكەیەكی لێ یە. یان بۆ خوا وەستاوە. یان لەركوع دایە یان لە كڕنوش بردن دایە) هەروەها

(٢) چونكە لەزمانی عەرەبی(ما) بۆ غیری عاقل بەكاردێت وەك دار و بەرد و گیانلەبەر... هتد.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: « هەموو ڕۆژێك(٧٠) هەزار ملائیکە دەچن بۆ تەواف کردن لە دەوری (بیت المعمورە) سەرەیان نایەتەوە جارێکی تر لەبەر زۆریان. کەواتە کەس نازانێ کامەیان زۆرترە. ئەقڵداریان بێ ئەقڵەکان ».

بەلام دەڵێین: (ما) بەکار هاتووە. چونکە بەندەکان و حاڵەکانیش دەگرێتەوە.

مەبەست بە حاڵەکان. هەڵسووڕاندنی کاروباری بەندەکانە چونکە خوای گەورە. هەرچی هەیە لە ئاسمان هی ئەوە هەروەها دروست کردنیان و بەڕێوە بردنیان سەرپەرشتی کردنیان هەر بەدەست ئەوە جا خوای گەورە بۆیە لەم ڕستەیە خەبری پێش (مبتدا) خستووە. چونکە ئەم پێش خستن و دواخستنە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بە تەنها هی خوایە. بۆ ئەوەی ڕێگەی ئەوە ببڕێت کە بگوترێت یەکێکی تریش لەگەڵی شەریکە.

جا ئەگەر هەموو ئەو شتانە بەدەست خوای گەورە بوو لە موڵك و بەڕێوبوردن و دروست کردن کەواتە دەبێ تەنها ببین بەبەندەی ئەم خوایە و خواپەرستی تەنها بۆ ئەم خوایە بکەین کە خوای ئەرز و ئاسمانەکانە.

هەروەها دەبێ سەبر بگرین لەسەر قەزاو قەدەری چونکە ئێمە موڵکی ئەوەین. ئەویش سەر بەخۆیە لەوەی هەرچی بکات لەموڵکی خۆی. جا ئەگەر ئەو قەزاو قەدەرییەندە لەسەر خۆی بوو یان لەسەر کەس وکارو خزمەکانی بوویان لەسەرماڵ‌وموڵکی بوویان لەسەر وولاتەکەی بوو. چونکە خوای گەورە هەرچی بیەوێ دەیکات. هەروەها خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿له مالي السموات ومالي الارض﴾ ئاسمانەکانی بە کۆهێناوە. وە زەوی بەتاک هێناوە نەک لەبەر ئەوەی زەوی یەک چینە. بەڵکو مەبەستی(جنسی) زەویەکە بەگشتی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِنْدَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ واتە: کێ هەیە بتوانێ‌شەفاعەتی بکات لەلای ئەو تەنها|مەگەر خۆی ڕێی پێدابێت.

لەم ڕستەیە (من) ڕاناوی پرسیار کردنەوە(مبتدا)ەوە (ذا) زیادەیە هیچ مانایەک|ناگەیەنێ وە (الذي) خەبەری (من)ە مەبەست بەو پرسیار کردنە. کە دەفەرموێت کێ هەیە شفاعەتبکات لەلای. پرسیار کردنێکە مانای نەفی کردنی ئەم کارە دەگەیەنێت. واتە کەس ناتوانێت. چونکە هەر لەدوای ئەوە دەفەرمووێ: ﴿الا بأذنه﴾ تەنها بەرێ پێدانی ئەو نەبێت.

جا هەرکاتێك نەفی کردنی شتێك بە شێوەی پرسیار کردن. ا هات بەمانای تەحەدا کردن دێت.

وە کە دەفەرمووێ: ﴿يشفع﴾. شەفاعەت لە زمانەوانی. مانای ئەوەیە تاکێك بکەی بە جووت.

وە لە زاراوەش لە شەرعدا بەمانای ئەوە بەکاردێت. واستە لەلای یەکێك بکەی بۆ ئەوەی زیانێك یان ناخۆشیەك لەسەر یەکێك لابەیت یا سوودێکی پێ بگەیەنی. شەفاعەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەرۆژی دوایی بۆ گوناهبارانی ئوممەتەکەیەتی. دوای گێزنی خوا بێگومان گەورەترین کەس، لە پلەو پایە پێغەمبەرە(ﷺ) لەلای خوا لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێ بەبێ ڕێ پێدانی خوا شەفاعەت بکات هەتا دەچێ سوجدە دەبات بۆ خوا حەمدو سوپاس و تسبیحاتی خوا دەکات. کە خوای گەورە فێری دەکات. ئینجا خوای گەورە پێی ئەفەرموێت: سەرت بەرز بکەرە. ع دەڵێیت گوێی لێ ئەگیرێ.شەفاعەت بکە شەفاعەتت وەرئەگیرێ. لەگەڵ ئەم پلە بەرزیەی پێغەمبەر(ﷺ) ناتوانێ بەبێ ئیزنی خوا شەفاعەت بکات. ئەمەش لە کەماڵی وگەورەیی و دەسەڵاتی خوایە چونکە هەرچەند گەورەی و دەسەڵات زیاتر بوو.

ئەوا بەندەکان زیاتر ڕێزو گەورەیی بۆ دادەنێن. چونکە ئەگەر پادشایەك زۆر بە دەسەڵات بێ کەس ناتوانێ لە مەجلیسەکەی ئەوەبێ ڕێ پێدانی ئەو قسەبکات ﴿ولله المثل الاعلى﴾. وە خوای گەورە ڕێ بەکەس نادات شەفاعەت بکات تەنها ئەوەی لێ ی ڕازیە. وە دەبێ لەو کەسەش ڕازی بێت کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت. هەربۆیە ناحەقەکان بێ باوەڕەکان. ناتوانن شەفاعەت بکەن. چونکە خوای پەروەردگار لێیان ڕازی نیە وە پێغەمبەرو پیاوچاکانیش ناتوانن شەفاعەت بۆ بێباوەڕان بکەن. چونکە خوای گەورە لەوانەش ڕازی نیە.

## کەواتە بەم جۆرە شەفاعەت کردن لەلای خوای گەورە سێ مەرجی دەوێت

یەکەم: خوای گەورە ئیزن بدات.

دووەم: خوای گەورە لە شەفاعەتکار ڕازی بێت.

سێیەم: خوای گەورە لەو کەسە ڕازی بێت کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت لەرسته شەشەم خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿یعلم مابین ایدهم وماخلفهم﴾.

عیلم، زانین لەلای شارەزایانی ئوصولەکانی دین بەمانای زانینی شتێك بە تەواوەتی بەبێ گومان لێ و حەقیقەتی خۆی و ڕاستیەکەی چونکە نەزانین. جەهالەتە. وەزانینی شت بەبێ یەقین لێ ی زانین نیە بەڵکو شك و گومانە. وەزانینی شتێك وە یەقینت هەبێ لەڕاستی. بەڵام بەشێوەیەکی ناتەواوی (مركب). ئەمەش زانستێکی کەم کوڕو تێکەڵاوە.

بۆ نموونە ئەگەر پێت بڵێن کەی شەڕی بەدر ڕوویدا؟

بڵێیت، نازانم. ئەوە جەهلە.

وە ئەگەر بڵێیت لەساڵی سێیەم یان دووەمی کۆچی بوو ئەوا شك و گومان.

وە ئەگەر بڵێیت. لە شەشەمی کۆچی ئەوا(مركب) تێکەڵاو و ناتەواوە.

جا عیلم و زانینی خوا زانستێکی تەواو شاملە. بەگشتی و بەوردی. وە زانینی وەك بەندەکان نییە ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ عیلمی ئەو شتەی ڕوویداوە و ئەو شتەی دێت و ڕووینەداوە لەلای هەیە ﴿وماخلفهم﴾ ئەو (ما) یە بۆگشتی بەکاردێت واتە زانینی هەموو شتەکان جا شتی گشتی بوویان ووردەکاری بوویان کارو کردەوەی بەندەکان

بوریان هی خوابوو وەعلمی خوابە ئەوەی ڕوویداوە. مانای ئەوەیە ئەوەی ڕوویداوە لەبیری ناچێت وە عیلمی بە ئەوەی ڕوونەداوە. مانای ئەوە دەدات کە ئەوەی ڕوونەداوە. بێ عیلم نیە لێیان بۆیە خوای گەورە لەرستەی حەرتەم دەفەرموێت: ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ﴾. واتە ئەوانەی خوای گەورە باسی کردن. کە هەموو دروست کراوەکان موڵکی ئەون. وە ڕابردوو وداهاتوویان ئەزانێ. هیچ علمێکی خواناازانن و ئەگاداری نین. مەگەر یەکێك بیزانێ کە خوا خۆی فێری بکات. ئابەم شێوەیە سیفەتی زانین لەبەندەو سیفەتی زانین لەخوا جیا دەکرێتەوە. کەسیفەتی عیلم لە بەندەکان ناتەواوە کەشتی ڕابردوو ئەزانن وە لەوانەیە لەبیریان بچێت وە داهاتووش بەهیچ شێوەیەك نازانن کەچی سیفەتی خوا لەعیلمدا تەواوەو کاملە وەك باسمان کرد چۆنە وە ووشەی (علم) کاتێك دەفەرموێ (عِلْمِهِ) چاووگە(مصدر). دوو ئیحتمال هەیە. یان مەبەست بەو عیلمە ئەوە یە کەئەوەی خوای گەورە دەیزانێ کەس نایزانێ مەگەر یەکێك خوای گەورە فێری بکات یان مەبەست بە عیلمە. زاتی خوایەو سیفەتی خوایە. کە کەس نازانێ زاتی

خوا چۆنەو نازانن سیفەتی چۆنە مەگەر یەکێك خوای پەروەردگار پێی بڵێت.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ولا يحيطون بشيء من علمه إلا بما شاء﴾ واتە: هیچ زانیاریەکتان دەربارەی علمی خوانی‌یە

ئایەتەکە هەردوو ماناکە دەگرێتەوە. وە هەردووکیان ڕاستن چونکە ئێمە هیچ ناوسیفەتێکی خوای گەورە نازانین تەنها ئەوانە نەبێت کەخۆی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فێری دووین بۆ نمونە خوا لەسەر عەرش ئیستوای کردووە. پێغەمبەر (ﷺ) فێری کردووین کەخوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ئەویش خوا فێری کردووە.

هەروەها لەو شتانەی خوای گەورە ئەیزانێت کەلە ئاسمانەکان و لەزەویدان. وەك ئەوەی خوای گەورە فێری کردووین کە ئاسمان حەوت چینە وەهەر خوای گەورە فێری کردووین کە مەلائیکە هەیە ئەگەر خوای گەورە نەبووایە ئێمە لەکوێ ئەمان زانی.

کەواتە ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەرە فێری بین فێرمان دەکات. جا ئەم فێر کردنە ناوسیفەتی خۆی بێت یان زانیاربێت دەربارەی گەردوون یان بەندەکانی ئەمەش لەڕێگای وەحی‌کردن بۆ بەندەکانی لە پێغەمبەران لەپاشان

دەفەرمووێ: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَاتِ وَٱلْأَرْضَ﴾..واتە: کورسی خوای گەورە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە کورسی خوا بریتی‌یە لە شوێنی دوو پێی خوای گەورە لەبەر ئەم عەرشی خوادا . وە ئەم تەفسیر کردنە. لە عبدالله ی کوڕی عباس هاتووە|بەمەو قوفی[٣] واتە نە بۆتە ووتەی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەندە عبدالله کوڕی عباس قسەی لەجوولەکەکان وەرگرتووە[٤] بەلام ئەم تەفسیرە کە لەسەر چۆنیەتی کورسی خوایە. کەس ناتوانێت بە ئەقلی خۆی لێکی بداتەوە وە ئیجتهادی تێدا بکات. بۆیە دەبێ بلێین ئەمە قسەی خۆی نیە بەلکو لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فێر بووە. چونکە ئەگەر سەحابی قسەیەکی ووت یان کارێکی کرد، کەمەحالی ئەقلی تیانەبو ئەوا دەبێ بلێیت لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فێربووە. بەلام ئەگەر قسە کردنەکەی گێڕانەوەی هاوڵێکی قەومانی پێشتربوو. وەزانرا ئەم سەحابیە کە لە جوولەکەکان فێربووە. ئەوا دەبێ بلێین ئەمە

---

(٣-٤) قسە وەرگرتن لەجوولەکە دروستە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (حدثوا عن بني اسرائيل ولاحرج) واتە قسە لەجوولەکە وەرگرتن هیچتان لەسەر نیە. بەلام قسەکەیان بەڕاست دائەنێین وە نە بەدرۆی دەخەینەوە.

هەواڵی جوولەکەکانە (اسرائیلیان) کە نەبەدرۆی دەخەین وە نەبەڕاستی دەزانین.

جا ئەمەڕای شوێنێکەوتووانی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەهلی سوننەو جماعە کە کورسی خوای گەورە شوێن پێیەتی ئەمەڕای(ابن تیمیة)یە وەڕای(ابن قیم)یە وە زۆر لە شارەزایانی شەرعو سەرمەزهەبەکان وە ووتراوە کە کورسی هەر عەرشە. بەڵام ئەمە ڕاست نیەعەرش زۆر لە کورسی فراوانترەو زۆر گەورە ترە وە گێردراوە تەوە لە(ابن عباس) کەوا فەرموویەتی کورسی خوا علمیی خوایە. ئەم گێڕاندنەوەیە لە عبدالله ی کوڕی عباس) بەڕاستی نازانم. چونکە ئەم تەفسیرە هەر لەڕووی زمانەوانیش ئەوا ڕاست نیە. کەواتە بەڕاستی نازانم کە عبدالله ی کوڕی عباس ئەم قسەی کردبێت چونکە کورسی شوێنی دووپێی خوایە وەفەرمودەیەك لەپێغەمبەر (ﷺ) هاتووە. کەوا دەفەرمووێ: «ماالسوات السبع والارضون بالنسبة الارض الا کحلقة في فلاة من الارض. وان فضل العرش علی الکرسي کفضل الفلاة علی تلك الحلقة»..واتە: هەموو ئاسمانەکان بەهەر حەوت چینەیەوە وەهەموو زەویەکان. لەچاو کورسی خوای گەورە وەك ئەڵقەیەکە لەبیابانێك. وە فەزڵی عەرش لەسەر کورسی وەك فەزڵی ئەم بیابانەیە لەسەر ئەڵقەکە.

ئەمانەش بەڵگەن لەسەر گەورەیی ئەم شتانە کە بۆ ئێمە جیهانێکی غەیبییە.

بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَفلم ینظرو الى سماء فوقهم کیف بنینها﴾..واتە: ئایا سەیریان نەکردووە ئێمە چۆن ئاسمانمان دروست کردوە لەسەریان جا خوای گەورە نەی فەرموو ئایا سەیریان نەکردووە چۆن کورسی و عەرشمان دروست کردووە چونکە ئەمانە لەلای ئێمە دیار نیە وەئەگەر خوای گەورە زانیاری پێ نەدابایین دەربارەیان ئەمان دەزانی کە مەن کە﴿السموات والارض﴾پان پشتی رای شێخی ئیسلام ابن تیمیە دەکات کەدەڵێت. کەئاسمانەکانو زەوی لەشێوەی گۆی دان. چونکە ئەم شتە هەست پێکراوە وە بەخەبەریش زانراوە.. هەرچەندە. بەخەبەر زۆر لەوانەی پێشینان نەیان زانیوە.

وە بەڵگەش لە قورئانی پیرۆز خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿واذا الارض مدت﴾ واتە لە قیامەت کاتێك زەوی وەك راخەری راخراو کرایەوە. دیارەپێشتر لوول دراوە بەشێوەی گۆیی. بۆیە دەکرێتەوە وەرادەخرێت. وەئێستا بەچاو بینراوە جائەگەر کورسی ئاسمان وزەوی گرتبێتەوە هەرچوار دەوری دابێ دیارە ئەویش وەك ئەوان گۆییە

وەهەرچی عەرشە لەپێغەمبەر(ﷺ)هاتووە کەعەرشی خوالەسەرو ئاسمانەکانە وەکو گومەزە بەلاّم وەك گومەزە خڕنیە وەتەختیش‌نیە بەڵکو وەك ڕەشماڵ ناوەندەکەی بەرزبۆتەوە پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا يَئُودُهُۥ حِفْظُهُمَا﴾ ﴿لايؤد﴾..واتە: لەسەری گران نابێت وناخۆش نیە ﴿حفظـهما﴾ پاراستنی ئاسمانەکان‌و زەوی. ئەمەش‌واتە سیفەتێکی خراپە کە خوای گەورە خۆی لێ بەدور دادەنێت.

ئەم پاراستنەش چەند هۆیەکی دەوێت. کە ئەم هۆیانە دەبن بە سیفەتی خوای گەورە. وەك ژیان‌و عیلم‌و توانا و ویست‌و ڕەحمەت‌و چەند سیفەتێکی‌تر بۆ نموونە نەفی کردنی ئەم سیفەتە کە نەتوانینی پاراستنی ئاسمان‌و زەویە. مانایی نەمانی توانای خوا دەگەیەنێ لەگەڵ ویستی‌و ڕەحمەتی چەند سیفەتێکی‌تر کەئەو کەسەی بیەوێت ئەرکی پاراستنی ئاسمانەکان‌و زەوی بگرێتە ئەستۆ. دەبێ هەیبێت.

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەم ڕستەیە هەردوو ناوەکە ناسراوە(معرفة) وە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە تەنها خوای گەورە خاوەنی ئەم سیفەتەیە. واتە خوای گەورە بەرزە بەرزیەکی ڕەها(مطلق) لە

هەموو شتێك بەرزترە. بەڵام هەرچی مرۆڤە بەرزی بەستراوە(مقید) بۆ بەندەكانە لە هەموو شتێك هەر بەرزنین وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ولا تهنوا ولا تحزنوا وانتم الاعلون﴾. واتە: ئێوەی موسولمان لەكافرەكان بەرزترن ئەوەك لەسەر هەموو شتێك. چونكە تەنها خوای گەورە لەسەر هەموو شتێكە.

جا بەرز بوونەوەی خوای گەورە لەلای سەلەفی صالح و ئەهلی سوننەو جماعە. دەبێتە دوو بەرز بوونەوە. بەرز بوونەوەی زاتی لەگەڵ بەرز بونەوەی سیفەتی.

بەرز بوونەوەی زات. بریتی‌یە لەبەرز بونەوەی زاتی خوا لەسەر هەموو شتەكان. كە هەموو شتەكان لەژێر ئەون. هەرخۆی لەسەر هەموویانە.

وە هەرچی بەرز بوونەوەی سفەتیە. بریتی‌یە لەوەی كە سیفەتەكان و ناوەكانی خوای گەورە بەوەسفی بەرز وەسف دەكرێت سفەتەكانی هەمووی بەرزن و پاكن و كاملن و تەواون لە هەموو ڕوویەكەوە.

وە ئەگەر ووتت بۆچی ئەم دابەش كردنە بەڵگەت هەیە لەسەری لەقورئان و فەرموودە. یان سەحابە ئاوا دابەشی كردووە. دەڵێم نەخێر. بەڵام ئەهلی(التعطیل) ناچاریان كردم. وابكەم. چونكە ئەوان دەڵێن خوای گەورە تەنها

بەسیفەتی بەرزە. بەلام بەزاتی خۆی بەرز نیە لەسەر شتەکان. منیش وەلامم دانەوە بە هەمان شێوە. سەلەفی سالحیش ئاوا ناچار بوون. ئەم دابەش بوونە بکەن چونکە تووشی خەڵکانێك هاتن کە بەشێکیان نەفی دەکردو بەشێکی تریان دان پیدادەنا.

ئەگەر یەکێك بێت و بڵێت خوای گەورە تەنهابەسیفەتی بەرزەئەوا خەڵکی عەوام لە مەتێنە دەگەیشتن بەلام ئێمە بڵێین خوای گەورە بەسیفەت و زاتی بەرزە خەیاڵیان دەربارەی بەرزی خوا. بەرزی زاتی یەتی رە ئەم جۆرە کەسانە کەنەفی بەرزی زاتی خوایان کردووە کە بە(معطلة) ناو دەبرێن بوون بە دووبەش.

بەشێکیان دەڵێن خوا بەزاتی خۆی لە هەموو شوێنێك هەیە. ئێمەش دەڵێین: ئەگەر خوا بەزاتی خۆی لەناری بێت ئەگەر شوێنگیربێت ئەوا کەس جێگای نابێتەوە نەك لەسەر زەوی لەسەر گەردوونیش ئەگەر خوای گەورە لاشەی نیە. کەواتە خوا بوونی نییە وەنابێ بڵێین وەك هەرایە چونکە ئەمە بۆیان ناگونجێ بەم شێوەیە بۆچوونەکەیان پوچەڵ دەکرێتەوە (بەشی دووەمیشیان) دەڵێن. خوای گەورە نەلەبەرزیە نە لەنزمیەوە نە لەناو

جیهانـەوە نەلـە دەرەوەی جیهانـە. وە نەلـە چەپـەوە نەلـە ڕاستەوە نە پەیوەندی پێی هەیەوە نە پـەیوەندی پێی نیە. وە ئـەوەش لـەکار خسـتنێکی تـەواوی نـاوو سـیفەتەکانی خـوای گەورەیـە. کـەمانایی نـەبوونی خوایـە. چونکـە تەنـها نەبوون (عدم) هیچ سیفەتێکی نیە.

هەندێك لە شارەزایان دەڵێن ئەگەر پێیان ووترا وەسفی (عـدم) بکـەن (نـەبوون). لـەو وەسـفەی معطلـە کـان (بەشـی دووەم) بۆ خـوای گـەورە. باشتر ئادۆزینەوەکە (معطلـە کـان) بـەم قسـەیە هیـچ و بەتاڵـەیان دان بـە بونـی خـوا دەنـانێن جابزانە لە کارخستنی (التعطیل) سیفەتی خوای گەورە چی لێکردن . وایان لیهات شتێك بڵێن کە نە عەقل وە نەقسەی خواو پیغەمبەرو (ﷺ) نە هەست کردن دەرکی پیێ دەکات .

بەرزی خوا لەقورئان و سوننەتی بیغەمبەرو ئیجماع [*] و ئەقڵ واڵیترەتی مرۆڤ

دانی پیادا دەنێت. جابـە لگـەکانی قورئـان و فـەرمودە هەمەجۆرن .

---

(*) إجماع :واتە : کوبوونەوەی هەمووزانایانی سـەردەمێك لەسـەریەك ڕا کەئەمەش مەحالـە ئـەم ڕایـە هەڵـەبێت چونکـە پیغمبـەر (ﷺ) دانی ئاوە بەمەدا

جارێکیان بە بە بەرز ناوی دێت وجارێکی تریان بە لە سەر شتەکان دێت وەجارێکیتریـان بەسەرکەوتنی شتەکان بـۆلای نـاوی دێـت وەیـان بەدابـەزینی شـتەکان لێیـەوە نـاودەبرێت وە چـەندان رەسـفی تـر کەناسـراون هـەموری هەربەماناى بەرزی خوادێت . هەروەها لەفەرموودەکانی پێغە مبەر(ﷺ) ئەوانەی بەقسەن یان بەکردەوەن یان بەدان پیانانن (إقرار) هـەموویان دەسـەلمێنن کـەخوای گـەورە لەبەرزییـە. لەقسـەکانی کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: «ربنا الـذي في السماء».واتە: لەوخوایەمان کەلەئاسمانە. وەبـەکردەوەش کاتێك پەنجەی ئیشـارەتی بۆئاسمـان کـرد لـەڕۆژی عەرەفـە کاتێك وتی خوایە بەشاهێدبە وەلەدان پیانانی.کاتێك وتی بە جاریە کـەخوا لـەکوێ یە وتـی لەئاسمانـە. فـەرمووی بـەرەلای بکـەن ئەمـەئیماندارە وەهـەرچی(ئیجمـاع)ی سەحابەی کانو تابیعینـەکان وسـەر مەزهەبـەکانو سـەلەفی ئومـەتت لەسـەر ئـەوەن. کـەخوا لـە سـەر عەرشـەکەیەتی وەکەسیان نەیووتووە لە هەموو شوێنیکە ..

*وەکەسیان نـەیوو تووە نەلەسەرەوە نەلـە ژێـرەوە نـە لەچەپـەوە نەلەڕاستـەوە. لـەڕووی (ئـەقل) لەدوورووو بەرزی خوا دەسەلمێنێت:*

رووی یەکەم: بەرزی سیفەتێکی جوان و تەواوە وە ئەگەر بەرزی سیفەتێکی کەمال و جوان تەواربێت بۆخوا ئەوا ئەو سیفەتە هەیە خوای گەورە چونکە خوای گەورە سیفەتەکانی ئەوپەڕی تەواون وجوانن وبەرزن.

رووی دووەم: ئەگەر بڵێن خوای گەورەیان لەسەرەوەیە یان لەژێرەوە یەیان لەچەپەیان لەڕاستەیە ئەگەر بڵێین لەژێرەوە یە. کەواتە خوای گەورە نەقسی هەیە (حاشاالله) وەئەگەر بڵێین لە چەپەیان ڕاستە ئەوایەکیان دەبێت بەڵام ئەگەر بڵێین لەسەرەوە یەئەوە سفەتێکی تەواوەو بەرزە وبێ هیچ کەم وکوڕیەکە. لەڕووی فیترەتی مرۆڤ. خوای گەورە هەموو زیندەوەرێکی دروست کردووە لەسەر سروشتێکی ئاوا کە لەدەروونی هەست دەکات خوای گەورە لەسەر هەموو شتێکە. هەربۆیە کاتێك مرۆڤ دووعا دەکات یەکسەر دەستی بۆئاسمان بەرز دەکاتەوە. هەربۆیەش کاتێك (ابوالمعانی الجوینی)ە ڕای وابووکە خوالەسەر عەرش نیە بەزاتی خۆی (ابو علی للهمدانی) ڕەحمەتی خوای لێبێت ووتی تۆ واز لەوە بهێنە. کەخوالەسەر عەرشەیان نا. چونکە خوای گەورە بەئێمەی فەرمووە کەلەسەر اعەرشە ئەگەر ئەو نەبوایە لەکوێ ئەمان زانی. بەڵام تۆوەرە باسی ئەم شتە

گر ـخەمان بۆبکە. کەهیچ کەسێك دووعا ناکات ئیلا لەدەروونیدا
مەست بە بەرزیتی خوای گەورە دەکات ئەمە چۆنە (ابو المعاني الجويني)
بەهەردووەستی لەسەری خۆی داوەتی بەدەنگی بەرزەوە
(حيرني الهمداني، حيرني الهمداني) عەیبداوو بۆ چوونی
گومڕاکردم. چونکەی نەیدەتوانی وەڵامی بداتەوە.
لەبەرئەوەی ئەم قسەیەی ابوعلی الهمدانی لەڕووی فیترەتەوە
بوو. وەفیترەتیش (سروشتی مرۆڤ) ڕەتناکرێتەوە. چونکە
فیترەتی مرۆڤ پاکەولەسەر ئیسلامە لە بنچینەدا
سەیرلەوەدایە کەئەوانەی ئینکاری بەرزبوونەوەی خوادەکەن
خۆیان ئەگەر دوعا بکەن دەستیان بەرزدەکەنەوە بۆئاسمان
وەنازانم. ئەم کەسە چۆن ڕووبەڕووی خوای گەورەدەبێت
لەرۆژی دوای ئەویش باوەڕی وایە کە خوا لەهەموو شوێنێك
هەیە. یان خوالەهیچ شوێنێك نیە وپاشان خوای گەورە
دەفەرمووێ: (العظیم) واتە: خاوەن هەیبەتو دەستەڵاتو
توانایە. و(عظیم) لەهەرشتێك دابێت مانای ئەوپەڕی
٤ ڕەی هەیە لەسیفەتەکانیو ئەوپەڕی کەماڵی (تەواوی)
هەیەهەروەها(عظیم) لەشتێك مانای ئەو پەڕی گرینگو
ئەوپەڕی سیفەتی جوانە.

## سوودەکان الفوائد

# لە تەفسیرکردنی ئایەتەکە چەند سوودێکی لێ دەردێت:

(١) دان نان بەپێنج یان شەش لەناوەکانی خوا چونکە من لەگوماندام لەوەی وشەی (إله) بکەم بەناو خوا، چونکە بەنەناساراوی هاتووە (نکرة) لەم ئایەتەوەهەرناوێکی سیفەتێکی خوایە.

(٢) وسەلماندنی ئەوەی کەخوای گەورە بەتاک و تەنیا شایستەی پەرستنە کەسی ترشایستەی ئەوە نیە

(٣) ڕەتدانەوەی قسەی بێ بارەوەکان. کەئەوان چەند خوایەکی تریان بڕیار دابوو بۆ خوا

(٤) سەلماندنی سیفەتی (ژیان) بۆ خوای گەورە. کەژیانێکی کامڵەو تەواوە بێ کەم و کوڕیە. وەپێشتر لەنەبوون دانە بووە. وەلە داهاتوو لەناو ناچێت.

(٥) سەلماندنی (قیومیة) تی خواوەتە ئەوپەڕی تەواوی لەکارەکانی وە هەڵسوڕاندنی هەموو کارو باری گەردوون و بەدەستەوە گرتنی جانەم سیفەتە بۆ مرۆڤ

نیە. چونکە کەس ناتوانێ کاروباری خۆی بەتەنیا هەڵسوڕێنێت. بۆنموونە ئێمە پێویستمان بەکرێکارمەیە کرێکاریش پێویستی بەئێمە هەیە. ئێمە پێوستمان بەئالرەتان هەیە. ئالرەتانیش پێوستی‌یان بەئێمە هەیە ئێمە پێوستمان بەمنالْ هەیە منالْش پێوستی بەئێمە هەیە. جاکەس نیە هەمووکاری یەکێکی تر هەڵسوڕێنێت هەرچەندە ئەگەر هەندیکی بەڕێوە دەبرێت

(٦) ئەم ئایەتە گەورە ناوی خوای تێدایە کە ﴿الحي القيوم﴾ ئەم دووناوەش تەنها لە (البقرة) و (ال عمران) و(طه) باسکراون وەشارەزایانی ئاین ئەڵێن. بۆیە ئەم دووناوە لەناوە هەرەگەورەکانی خوان چونکە هەموو سیفەتەجوان وبەرزاکانی خوای تیایە.

(٧) کەماڵی وتەواوی ژیان و قیومەتی خوا کە کەم ترین کەم و کوڕی تێدانیە.

(٨) سەلماندنی سیفەتە خراپەکانی (السلبيه)کاتێك دەفەرمووێ: ﴿لاتأخذه سنة ولانوم﴾ وە﴿لايؤده حفظهما﴾ ئەمانە سیفەتی‌خراپن. بەلام بۆیە خوای گەورە باسی کردووە کەمەبەستی نەفی کردنی ئەم

سیفەتانەیە لەخۆی وە بۆ ئەوەی دژی ئەم سیفەتانە وسیفەتەکانی خوای گەورەیە.

(٩) هەموو مولك هی خوایگەورەیە. وەك دەفەرمووێ: ﴿لـه مافي السموات ومافي الأرض﴾ ئـەوەی لەئاسمانـەکان زەویدایە هی خوای یە.

(١٠) تایبەت مەندی خوای گەورەبە سیفەتی خاوەن مولك. ئەمەش لە﴿له مافي السموات ومافي الأرض﴾ دەردەکەوێ وەك باسکرا. کەخەبەرەکەپێش. (مبتداء) کـەوتووە ئەمـەش مانایی تەنهای سیفەتی خاوەن مولك بۆخوایە.

(١١) سەلماندنی بونی ئاسمانەکان زەوی ﴿لـه مـافي السموات ومافي الأرض﴾ وەژمـارەی ئاسمانـەکان چەند ئاسمانێکە. وەهەرچی حەوتە یاژمارەیەکی تـرە ئەوانـە لەشوێنێکی تر باسکراوە.

(١٢) ئەو پەری دەستەلات و سولتان بۆخوای گەورە ﴿من ذا الذي يشفع عنـــده الا بأذنـــه﴾ وەك باسکرا. کەس ناتوانێ شەفاعەت بکات بەبێ ئیزنی خوای گـەورە. ئەمەش لەوەمایی دەستەلاتی خوای گەورەیە.

(١٣) ســەلماندنی بوونـــی شەفاعەت، دوای ئـیزنی خـــوا لەرۆژی دوایی.

(١٤) سەلماندنی ئیزنی خوا کە ئەویش لەفەرمانە ﴿الا بأذنه﴾.

(١٥) سەلماندنی عیلمی خوا کە گشتی یە بۆ رابردوو وداهاتوو. وەك دەفەرمووێ: ﴿یعلم مابین ایدهم وماخلفهم﴾.

(١٦) وەلام ڕەتدانەوەی (قەدەریەکان)ە. کەعیلمی خوا بۆ رابڕدوو وداهاتووە. چونکە قەدەریەکان دەڵێن خوای گەورە کاری بەندەکان نازانێ هەتا ڕوونەدات .

(١٧) وەلام دانەوەی[1](خوارج) و(معتزلة)[2]کانە. لە سەلماندنی شەفاعات. چونکە ئەم دوو کۆمەڵەیە ئینکاری شەفاعاتی پێغەمبەر (ﷺ) وپیاوچاکان دەکەن لەدوای ئیزنی خوا بۆ گوناهبارانی موسڵمانان . چونکە دەڵێن گوناهبار قەت لەجەهەنەم دەرنایەت .ئەگەر مردوو تۆبەی نەکرد چونکە لەلای ئەوان کافرە ئەرکەسەگوناهێك بکات.

(١٨) هەروەها کەس عیلمێك یان زانیاریەك دەربارەی خوای گەورە نازانێ یان دەربارەی ئەو عیلمەی خوای گەورە هەیەتی هاروەها ئەگونچکە گوێی لێ‌نەبێ وەنەچاو دەیبی نێت .

١) خەوریجەکان کۆمەڵێك بوون لە سەردەمی ئیمامی علی بوون لە فەرمانی دەرچوون وە بڕچوونیان وابوو کەوا هەرکەسێك گوناهێك بکات کافرە . وەك زینار دزی .

٢) معتزیلەکان کۆمەڵێکی گومرا بوون سەرزکەکەیان (واصلی کوڕی عطاء) بوو لە سەردەمی (حسنلیبصری) بوون دەیان ووت : هەرکەسێك گوناه بکات نە کافرەو نە موسڵمانە لە نێوان هەردووکیانە . وەلە قیامەتا دەچێتە جەهەنەم بە هەتا هەتایی .

(١٩) ئێمە هیچ شتێك دەربارەی دروست كراوەكانی (مخلوقات) خوا نازانین وەهیچ شتێك نازانین دەربارەی زاتی خوا. تەنها ئەوە نەبێت كەفێری كردووین.
﴿ولا يحيطون بشيء من علمه﴾.

(٢٠) حەرام بوونی باسی چۆنیەتی سیفەتی خوا چونكە خوای گەورە فێری نەكردووین چۆنیتی (التكيف) سیفەتەكانی چۆنە. بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرمووێ: (دەستم هەیە. بەڵام نافەرمووێ ئەم دەستە چۆنە...هتد)

(٢١) وەڵام دانەوەی (معطلة) كان كەدەڵێن ئەم سیفەتانە سیفەتێكی حەقیقی نین خوای گەورە تەنها ئەم سیفەتانە ئەداتە پاڵ خۆی بۆ مەجازی ئەوەك لەئەصلدا ئەم سیفەتەهەبێ بۆنموونەدەڵێن كاتێك خوای گەورە دەستی هەیە ئەوەك دەستی ڕاستی بەڵكو مەبەستی بەم دەستە هێزە ئەم بۆچوونەی ئەوان مانای ئەوەیە كەئەوان زاتی خوایان بینیوە وناسیوە!!!

خوای گەورەش دەفەرمووێ ﴿ولا يحيطون بشيء من علمه الا بما شاء﴾ هیچ شتێكی دەربارەی نازانن مەگەر خۆی فێریان بكات چونكە مرۆڤ. شتێك دان پێدائەنێت. كەعیلمی پێ هەبێ بیناسێ وبزانێ هەیە

وەشتێك ئینکار دەکات. کەبزانیٚ نیە بەلاٚم خۆنەمانە خوایان نبینیوە. ئەگەر بەڵگەشیان هەیە بابیهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن چونکە نەخوای پەروەردگار نەفی ئەم سیفەتانەی لەخۆی کردووە وەنە پێغەمبەرەکەی (ﷺ).
وەنەسەلەفی سالْح

(٢٢) وەلاٚم دانەوەی (مثلة) کان چونکە ئەگەر ئایەتەکە ڕەددانەوەی (مکیفة) کانی تێدابێت [٦] ڕەتدانەوەی ئەوەنیشی تێدایە.

(٢٣) سەلماندنی ویست (مشیئە) بۆخوای گەورە گەویستی هەیە لەسەر ڕوودانی ڕووداوەکان وەك دەفەرمووێ (إلا بما شاء).

(٢٤) ڕەددانەوەی قەدەریەکان وموعتزیلەکانە کەدەڵێن خوای گەورە هیچ ویستێکی لەکردنی کردەوەکانی مرۆڤ نیە !! بەلاٚم وانیە کردەوەو ویستی (مشیئة)ی مرۆڤ خوای گەورە دروستی دەکات.

(٢٥) گەورەی کورسی خوای پەروەردگار ﴿وسع کرسیه السموات والارض﴾.

---

(٦) ئەوانەی لەخاڵ (٢٠) باسیان کردووە.

(٢٦) گەورەی خوای ئەم کورسییە. چونکە گەورەی دروست کراو (مخلوق) مانای گەورەی دروست کارە (الخالق).

(٢٧) کافربوونی ئەو کەسەی ئینکاری ئاسمانەکان و زەوی دەکات. چونکە ئەمە دەبێتە هۆی بەدرۆ خستنەوەی خوای گەورە. کەدەڵێت ئاسمان و زەوی هەن وە ئەمزانیەوە کەس ئینکاری بوونی زەوی بکات بەڵام ئاسمانەکان هەندێك کەس ئینکاری بوونیان کرد. وەدەڵێن ئەوەی لەسەر مانە بۆ شایە (فضاء) کوتایی نیەو سنوری نیە. تەنها (السدوم)(٧) ئەستێرەی تێدایە. ئەم کەسە شك و گومانی لەکافربوونی دانیە جائەگەر خۆی باوەڕی ئاوا بوو یاتەقلیدی کەسانێکی دەکرد کەبۆ چوونیان ئاوەبوو.

(٢٨) سەلماندنی هێز بۆ خوای گەورە (القوة).

﴿ولا یؤده حفظهما﴾.

(٢٩) نەفی کردنی ماندوو بوون لەخوای گەورە: ﴿ولا یؤده﴾ کەخوای گەورە نەفی ئەم سیفەتە خراپە دەکات لە خۆی

---

(٧) سەدوم برتتی یە لەومادەی کە ئاسمانی لێدروست دەبێت کەوەکو دەوکەڵ... [illegible]

ئەمەمش وەك ئەم ئایاتەیە. ﴿وما مسنا من لغوب﴾ واتە: هیچ ئێش رماندور بوونێك توشمان نەهات. لەكاتی تەواوبوون لەدروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی .

(٣٠) سەلماندنی ئەوسیفەتانەی كە ئەم رستەیە پێویستی پێیە ﴿ولایؤده حفظهما﴾ ئەگەر ماندوونەبێت دەبێ سیفەتی ژیان (الحیاة). وەزانست (العلم) وەتوانا (القدره) وەرەحم و بەزی (الرحمة) وەكارزانی (الحكمه) وەهێز (القوة).

(٣١) ئاسمانەكان وزەوی پێوستیان بە پاراستنی خوای گەورە هەیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ولایؤده حفظهما﴾ ئەگەر پاراستنی خوای پەروەردگار نەبووایە لەناودە چوون.وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ویمسك السماء ان تقع علی الارض الا باذنه﴾.

(٣٢) سەلماندنی سیفەتی بەرزی خوا بەزاتی و بەسیفەتەكانی وەك دەفەرمووێ: ﴿وهو العلي﴾.

(٣٣) وەلام دانەوەی (الحلولیة) [8] یەكان و (معطلة) كان (حلولیة) كان دەڵێن خوا لەبەرزیدانیە. بەڵكو لە هەموو

---

(٨) الحلولیة: لەزمانی عەرەبی لە حلول هاتووە واتە چونە ناو یەك كە مەبەستیان بەم چونە ناو یەكە خواو دروست كراوەكانیەتی

شوێنێك دایە. (معطلة) كان[٩] دەڵێن. خوا وەسف ناكرێت بەوەی لەبەرزی بێت یان لە ژێرەوەبێت یان لەچەپەوە یان لەڕاستەوە بێت. یان لەناوجیهان بێت یان لەدەرەوەی.

(٣٤) ئاگاداری بوون لەوەی غروری بتگرێت. وخۆت بەگەورە بزانی لەسەر خەڵكی. ئەگەر پلە و پایەكت هەبوو چونكە گەورەی و بەدەستەلاتی وبەرزی خوات لەبیربێت ئەگەر ئەم خەیاڵت كرد.﴿وهو العلي العظيم﴾.

(٣٥) سەلماندنی ﴿عظمة﴾ بۆخوای گەورە ﴿العظيم﴾.

(٣٦) سەلماندنی تەواوی وڕاست و جوانی و گەورەی و كەماڵی سیفەتی خوای گەورە كاتێك ﴿العلي﴾ و﴿العظيم﴾ لەگەڵ یەكتری باسكراون.

(٣٧) هەروەها لە بەرئەوەی هەموو شتێك موڵكی خوایە دەبێ ئێمەش موڵكی خوا سەرلەنەكەین لەوەی كەبەخشیویەتی بەئێمە لە شتێك كە لێی ڕازی نە بێت.

(٣٨) حوكم كردن لە نێوان خەڵكی. دەبێ بەحوكەی خوای پەروەردگار بێت وەحوكم كردنی خەڵكی لەنێوان خۆیان بەحوكمە دروست كراوەكان (الاحكام للوضعية) جۆرێكە لەجۆرەكانی شیرك.

---

(٩) معطلة: لەزمانی عەرەبی لە (عطل) وەهاتووە واتەلە كارخستن مەبەستیان بەم لە كارخستنە سیفەتە كانی خوایە كەدەڵێن بوونی نیە

(٣٩) ڕازی بوون بەقەدەری خوای گەورە چونکە کاتێك دەزانی هەموو مولك هی خوای گەورەیە دەڵێی . مولکی خۆیەتی چی ویستی لەسەر بێت دەیکات ﴿لا یسئل عما یفعل وهم یسئلون﴾ خوای گەورە پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی دەیکات بەڵام ئێمە پرسیارمان لێ دەکرێت. چونکە خوا هەموو شتەکان مولکی خۆیەتی. بەڵام بەندەکان هیچ شتێك هی خۆیان نیە بگرە لاشەی خۆشیان بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی مردنی کچەکەی فەرمووی: « ان لله ما اخذ وله ما ابقى وكل شيء عنده باجل مسمى »..واتە: ئەوەی خوا بردیەوە هی خۆی بوو. وەئەوەی مارە هەرهی خۆیەتی. وەهەموو شتێك لەلای بەئەجەلە.

(٤٠) موعجیب نەبوونی مرۆڤ بەکردەوەکانی چونکە کردەوەکەشی هەمووی مولکی خوایە .

والله أعلم

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله

وصحبه اجمعين